پەیامەکانی بەرەو بەهەشت زنجیرە (٩٤)

# ٩٩ شیفا

## وەڵامی شەرعی ٩٩ پرسیارە کە لەئێمرۆدا باوە

ئامادەکردنی

باوکی چیای خولەکان

هەولێر

٢٠١٨ز ١٤٣٩ك

زنجیره

(٩٤)

# ٩٩ شیـــفا

## وەڵامی شەرعی (٩٩) پرسیارە کە لەئێمڕۆدا باوە

ئامادەکردن

باوکی چیای خولەکان

١٤٣٩ك - ٢٠١٨

# بسم الله الرحمن الرحیم

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی یەکجار زۆر بۆ خودای بالا دەست و صەلات و سەلامیش بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو کەسەی بە درێژایی ژیانی بونەوەر کەسی وا چاك و بەوەفا نەبینراوە پاشان لەسەر یارو یاوەرانی و تێکڕای موسڵمانان.

ئێمە لەدەنگی ئیسلام –ڕادیۆی هەولێر– لەسالانی ٢٠١٦ و ٢٠١٧ بەرنامەیەکمان ئامادەو پێشکەش دەکرد بەناوی زانست لەنێوان پرسیارو وەڵامی شەرعی کە تێیدا پرسیاری بیسەرانمان تۆماردەکرد و لای مامۆستایان و زانایان بەتایبەتی یەکێك لەمان کە بەراستی زاناو لەخواترس بوو زۆر بە خەمخۆریەوە وەڵامی دروست و بەڵگەداری پرسیارەکانی ئێمەی دەدایەوە خودای میهرەبان بەر میهرەبانی خۆی بخات.

جا لەم بەرنامەیەدا زیاتر لە (٢٥٥) پرسیارمان وەڵام دایەوە و ئێستاش ئەم (٥٥) پرسیارەمان تێدا هەڵبژارد وا هەستمان کرد لەوانی تر پێویستترن ئەگەریش (ان شاء الله) توانابوو تێکڕای بەچاپ دەگەیەنین.

لەگەڵ ئەم (٥٥) پرسیارە چەند فەتوایەکی تایبەت بە ئافرەتانیشمان هەبوو کە لەزنجیرە خولەکانی رادیۆ ئامادەمان

کردبوو، پەرۆشی چاپ کردنی بوم بۆ خوشکانی خۆم، ئێستا بووە دەرفەت خستمە پاشکۆو کۆتایی ئەم زنجیرەیە.

خوای گەورەش خۆی زاناترە بەهەموو وەڵامەکان و لەکەم وکورتی و بەدڵ نەبوونی هەندێ وەڵام ببورن و داوا لەخواش بکەن ببورێ چونکە (والله اعلم بالصواب)و بە ئومێدی پاداشتیشم خودا لێمی قەبول بکات، اللهم امین.

**هۆگر قاسم**

**باوکی چیای خولەکان**

**هەولێر ٢٠١٨**

# وەڵامی (٥٥)

# پرسیاری شەرعی بەپێی قورئانو فەرموودەو فەتوای زانایان

**پ١/ئەگەر ئیمام و مەئمومێك نوێژیان بە جەماعەت كرد چۆن صەف ( ریز ) دەبەستن؟**

وەلام/ئەگەر مەئمومەكان زۆر بوون سونەتە ئیمام لەریزەكی سەربەخۆ بێت ، مەئمومەكانیش لەریزەكی تر، بەلام ئەگەر شوێنەكە تەسك بوو ئەوا دروستە ئیمامیش لەریزی یەكەمی مەئمومەكان بوەستێ بەیەكەوە.

ئەگەر تەنها ئیمام و مەئمومێكیش بوو ئەوا سونەتە مەئمومەكە لەلای راستی ئیمامەكە بوەستێ لە یەك ریز ئینجا دەبێت بە یەكسانی لەتەنیشت یەكتر بوەستن بەبێ ئەوەی یەك پەنجەش پێش و پاشیان هەبێت، بەبەلگەی ئیمامی بوخاری بابێكی داناوە و دەلێ ئەگەر دوو كەس بوون ئەوا (سواء ) واتە یەكسان رادەوەستن كە لەفەرمودەی ئیبن عباس هاتوە كە نوێژی لەمالی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كرد لەمالی مەیمونە كە پلكیەتی (خودا لێیان رازی بێت) دەفەرموێت : (لما روى البخاري (٧٢٦) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال : " صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَأْسِي مِنْ وَرَائِي ، فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ فَصَلَّى."

جا (ئیبن حجر) لە (فەتح) دا راڤەی ئەم فەرمودەیەی بوخاری دەکاو دەڵێ (وظاهره مساواة أي سواء ً بسواء، لا تتقدم عنها ولا تتأخر).

واتە: ئاشکرایە بەیەکسانی هەردووکیان لەنوێژدا بەیەکەوە وەستاون نە پێش دەکەوێ نەدوا دەکەوێ؛

**پ٢/یادی لەدایك بوون ( عید المیلاد ) دروستە یان دروست نیە؟**

وەڵام/ئەم عادەتە لەناو موسڵمانان نەبوە بەڵکو لەناو غەیرە موسڵمانان بوەو هاتۆتە ناو موسڵمانان بۆیە ئەمە چاولێکردنەوەیە لەجولەکەو گاورەکان کە ئەمەش دروست نیە و حەرامە بە پێی فەرمودەی (ابن عمر – خوا لێی رازی بێت–) کە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرمویەتی : (من تشبه بقوم فهو منهم) رواه ابوداود (صحیح).

هەروەها لەفەرمودەی دایکە (عائیشە)دا هاتوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی (من أحدث في أمرنا هذا ما لیس منه فهو رد) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردوە.

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ئومەتەکەی پەروەردەکردووە لەسەر ئەوەی موخالەفە، جولەکەو گاورو موشریکەکان بکەن لەهەموو دابو نەریتێکدا هەروەکو پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (خالفوا المشرکین) بوخاری ومسلم.

**پ٣/زۆر والله بەكاردێنم لەكاتی قسەكردن دا ئایا گوناهبار دەبم یان نا؟**

وەڵام/ئەو والله یانەی خوی پێوە گرتیەو زمانی لێرا هاتیە خودا لێی ناگرێ هەروەكو خودای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ : ﴿لا یؤاخذكم الله باللغو فی أیمانكم﴾ كەواتە خوای گەورە چاوپۆشی لە ئەو والله یە دەكات كە زمانی لێراهاتیە بەڵام باشتر وایە وازی لێ بینی و سوێند نەخوات ئەگەر بۆ حەقی خۆشیشی بوو.

**پ٤/ئایا ئەو كەسە تاوان بار دەبێ كە بانگ بدات و دەنگ ناخۆشەو كەسێكی دەنگ خۆشیش لەوێ بێ؟**

وەڵام/ بەڵێ بێگومان گوناهبار دەبێت ، چونكە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەڵێتە (أبو معذورة) تۆ بانگ بدە چونكە دەنگی خۆش و بەرز بو، هەروەها لەفەرمودەی (عبدالله كوری زەید) هاتووە (خوا لێیان رازی بێ) كە خەون بە بانگەوە دەبینێ ، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ : بۆ بیلالی دووبارە بكەوە با بانگ بدات (هو أندی منك صوتاً) واتە ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترە.

هەروەها زانایان لەوان (ابن قدامە المقدسی) دەفەرموێ: سونەتە ئەو كەسە بانگ بدات كە دەنگ و بەرزو خۆشە ئەگەریش بووە كێشە با دەنگ ناخۆشەكە بانگ بدات و تەفرەقەو كێشە لەناو مزگەوت روونەدات.

**پ٥/ئایا ئایەتی شەشی سورەتی لوقمان باس لەحەرام بوونی مۆسیقاو گۆرانی دەکات؟**

وەلام/ لەبارەی حەرام و قەدەغە بوونی مۆسیقا زانایان زۆریان باس کردووە و کتێبی زۆری لەسەر دانراوە و بەلگەکان ئەوەندە ئاشکران ئەم و مژی نەهێشتوە ، بەلام لەبارەی گۆرانی راجیایی لەنێوان زانایان هەیەو هەندێك پێیان وایە ئەگەر وشەو هۆنراوەکەی شەرعی بێ گوتنی ئاساییە بەلام گوتنی لەگەل مۆسیقا هەر دەچێتەوە بازنەی حەرام وقەدەغەکراوەکان.

جا لەبارەی ئایەتی (٦) ی سورەتی لوقمان پێویستە سەرەتا تەفسیرو هۆی دابەزینی (سبب نزول)ی بزانین ئینجا دێینە سەر رای زانایان.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ لقمان: ٦

واتە:هەندێك خەلکی هەن قسەی بێ خێرو بێ مانا دەکڕن (وەك گۆرانیە ناپوختەکان، کتێب و شریتە بێ خێرەکان...هتد). تا خۆی و کەسانی تریش لەرێبازی خوا وێل بکات، بۆ ئەوەی هەست بکات بە مەترسی کارەکەی و بزانێت ﷺ کەتنێك دەکات بە خۆی و خەلکی و بۆیە ئەو شتە بێ نرخ و بێ خێرانە دەکڕێت تا گالتە بە پەیام و رێبازی

خـوا بکـات، ئـا ئەوانـە سـزاو تۆڵەیـەکی ریـسواکەرو ئـابڕوو بـەر چاوەڕێیانە(تەفسیری ئاسان).

**هەروەها هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە:**

ئـیبن عـەباس (خـوا لێیـان رازی بێـت) دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە لەسـەر نەضری کوڕی حارث دابەزی کاتێك گۆرانی بێژێکی ئافرەتی کڕی، ئەم پیاوە هەر کە بیزانیبوایە یەکێك دەیەوێت بێتە ریزی موسـڵمانان واتـە موسڵمان ببێت بەپەلە دەچوە لای گۆرانی بێژەکە وپێی دەووت: وەرە خواردنی بۆ تێکە، وەرە عارەقی بۆ تێبکە و گـۆرانی بـۆ بڵـێ، چـونکە ئەم خواردن و خواردنەوەیە و گۆرانیە باشترە لـەوەی کـە موحەممـەد بانگهێشتان بۆ نوێژو رۆژو دەکات و کوشـتار بکـەی لـەژێر لـە دەسـتی ئەودا، بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی) (السیوطي).

**ئینجا با بێینە سەر رای زانایان:**

١.عەبدولای کوڕی مەسعود (خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێ: (سوێند بە خوا ، مەبەسـتی گۆرانیـە، سـوێند بـە خـوا مەبەسـتی گۆرانیـە، سوێند بە خوا مەبەستی گۆرانیە) (تفسیر الطبري).

٢- جـابری کـوڕی عەبدولا (خـودا لێـی رازی بێـت) دەفـەرموێ: ئـەم ئایەتە (لهو الحدیث ) مەبەستی گۆرانی و گـوێ گرتنیـەتی ) تفـسیر الطبري).

٣.عەبدوڵای کوڕی عەباس (خودا لێی ڕازی بێت)دەفەرموێ: ئەم ئایەتە (لهوا الحدیث) مەبەستی گۆرانی و لەوچوەکانێتی ) بخاری ڤ الادب المفرد.

٤.عەبدوڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێ: ئەم ئایەتە (لهو الحدیث) مەبەستی (گۆرانیە).القرطبي.

٥-موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: مەبەست لەم ئایەتە(لهو الحدیث) کڕینی گۆرانی بێژی کوڕ یان کچە، وە گوێ لێگرتنی گۆرانیە، وە گوێلێگرتنی گۆرانیش باتیلە) روح المعاني.

٦-موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: مەبەست لەم ئایەتە (لهو الحدیث) مەبەستی گۆرانیە) الطبري.

٧-عیکریمە (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) : (ئەم ئایەتە (لهو الحدیث) مەبەستی گۆرانیە).الطبري.

٨-مەکحول (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) : (ئەم ئایەتە (لهو الحدیث) مەبەستی گۆرانیە). الدر المنثور.

٩-مەکحول (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) : (ئەم ئایەتە (لهو الحدیث) مەبەستی کەنیزەکانی دەف لێدەرن). روح المعاني.

١٠-إبراهيمى نەخعى (رەحمەتى خواى لەسەر بێت) : (ئەم ئايەتە (لهو الحديث) مەبەستى گۆرانيە) الدر المنثور. لەگەڵ سەدان تفسيرو بەڵگەى تريش.

## پ٦/حوكمى سميڵ تاشين لەئيسلام دا چيە؟

وەڵام/ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : (أحفوا الشوارب و اعفوا اللحى). واتە: سمێڵتان كورت بكەنەوەو ريشتان بەردەنەوە.

كەواتە لەشەريعەتى پيرۆزى ئيسلام زانايان دەفەرمون پێويستە سميڵ كورت بكرێتەوە لەگەڵ تەنككردنيش، هەروەها ريشيش دەبێ بەربدرێتەوە بەڵام زانايان دەفەرمون ژێر چەناگەو گەرو دەتواندرێت لا ببرێت.

## پ٧/ئايا ئيمام دەتوانێ لە پێش نوێژدا قورئانەكەى دواى فاتيحە لەسەر مصحف بخوێنێ؟

وەڵام/ لەنوێژى سونەتدا ئاساييە بەبەڵگەى زەكوان كە لەغولامەكانى دايكە عائيشە بوو (خودا لێى رازى بێ) پێش نوێژى بۆ دايكمان دەكرد لەتەراويحى رەمەزاندا لەسەر مصحف قورئانى دەخوێند.

بەلام لەنوێژی فەرزدا سێ را هەیە، یەکێکیان دروست نیە هەروەکو پرسیار لەئیمامی احمد کرا(رەحمەتی خوای لێ بێت) گوتی لەنوێژی سونەت جائیزەو لەنوێژی فەرز جائیز نیە.

رای دووەمیش وایە کە لەفەرزیش دا دروستە بەلام رای بەهێز ترەکەی (ابن قدامە المقدسی)یە کە دەفەرموێت مەکروهە واتە ناپەسەندە، بەلام بۆ کەسێك هیچی لەبەر نەبێت لەفەرزیشدا ئاساییە لەسەر مصحف بخوێنێ.

**پ٨/ئایا پارەت لەقەرد بێت هەموو ساڵ زەکاتی لێ دەکەوێت؟**

**وەلام/** دوو جۆر قەردمان هەیە: (مردوو، زیندوو)

- قەردی مردوو ئەوەیە ئەگەر یەکێك نەیتوانی قەردەکەی بداتەوە بەهۆی کارەساتێك یان زەرەرێکی گەورە کە بەسەری هاتوە یان بەزۆرداری داگیری کردووە و ناتداتەوە، جا ئەم قەردە کە تۆ ئومێدت پێی نەماوە ئەگەر دوای دە ساڵیش وەرتگرتەوە ئەوە قەردی تەنها یەك ساڵ دەدەیت.

-قەردی زیندوش ئەو قەردەیە کە لای کەسێکەو متمانەی تەواوت هەیە هەرکاتێك داوا بکەیت دەتداتەوە ئەوە ئەم قەرزەیە هەموو ساڵێك زەکاتی لێ دەدەی، بەمەرجی گەیشتبێتە (حد النصاب والحول)، واتە: رێژەی زەکات لێ کەوتنو ساڵ سورانەوە.

**پ٩/لەبەر کردنەوەی گۆریە ( خوف ) دەست نوێژ دەشکێنێ لەکاتێك کەوا مەسحت لەسەر کردبێت کە دەست نوێژت پێ هەڵگرتیە؟**

**وەڵام/** سەرەتا پێویستە هەندێ روونکردنەوە بدەین لەسەر مەسح لەسەر گۆریە، زانایان سێ رایان هەیە:

یەکەم: هەندێ زانا دەڵێن مەسح لەسەر ئەو خوفە دەکرێ کە جلد بێ و بەهێز بێ و پێی برۆی.

دووەم: هەندێکی تر دەڵێن مەسح لەسەر ئەو خوفە دەکرێ کە پێیەکانی داپۆشت بێ واتا پێستەکەی شاربێتەوە .

سێیەم: هەندێکی تر دەڕێن مەسح لەسەر هەموو گۆرەویەك دەکرێ ئەگەر تەنکیش بێ کە ئەم رایە بەهێزەو بەڵگەیان زۆرترپێیە.

کەواتە مەسح لەسەر گۆریە دەکرێ ئەگەر لەماڵ بوو شەوو رۆژێك و ئەگەر لەگەشت دابوو سێ شەوو سێ رۆژ بەمەرجێ پێ خستنە ناو گۆریەکە لەسەرەتادا بەدەست نوێژەوە بوبێ.

بۆ وەڵامی پرسیارەکە لای شافیعی لەپێ کردنەوەی گۆریەکە دەست نوێژ دەشکێنێ، بەڵام زانایانی تر دەڵێن ناشکێنێ جا رای بەهێز ئەوەیە ناشکێنێ.

**پ١٠/ يەكێك جیرانی مزگەوتە و نایەتە مزگەوت، سوكایەتیش بە مزگەوت دەكات.**

وەلام/ ئەگەر نوێژ بكات و نەیەتە مزگەوت و جەماعەت ئەوا رای بەهێز ئەوەیە نوێژەكەی دروستە بەلام چاكەیەكی زۆری لەدەست داوە ، لەوانەیە تاوانباریش بووبێ لە بەر فەرمودەكەی عومەری كوری خەتتاب كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی : (لا صلاة لجار المسجد إلا في المسجد) بەلام سوكایەتی كردن بە هەر پیرۆزیەك و دروشمێك لەدروشمەكانی ئیسلام جا چ پەیوەندی بە نوێژەوە بێ یان رۆژوو یان جەژن یان سەلام هەتا سیواك و ریش و حیجاب و...هتد ئەم سوكایەتیە كوفرەو خاوەنەكەی ئەگەر بە زانینەوە بیكات پێی كافر دەبێت بەبەلگەی ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴾ التوبة ٦٥-٦٦. كاتێك تۆ ئەی پێغەمبەر لەگوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریكی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەراستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمەو گاڵتەمان دەكرد ،پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەكانی و پێغەمبەرەكەی گاڵتەتان دەكرد؟!(ئیتر بێ

سوده ) پاکانه مەکەن چونکە بەراستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لەرواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو.

**پ١١/زیکرکردن لەشوێنی فەرمبالغ تەنها بە دڵ دەبێ؟**

وەلام/بەڵێ دەبێ و دروستە و کارێکی پیرۆزە، باشترە بە دڵ و بە زوبان بێ بەلام کە گونجاو نەبوو بابەس بە دڵ بیکا.

**پ١٢/ئایا دروستە ئاودەست و گەرماو ( حمام ) پێکەوە بن؟**

وەلام/دروستە بەمەرجی پیسی ئاو دەستەکە بە جیا بڕوات و تێکەڵ بە ئاوی حەمامەکە نەبێ و دوایی لەوێ خۆی بشوات و توشی وەسوەسە ببێ، چونکە (نهى رسول الله صلى الله عليه وسلم أن يبول أحدكم في الماء المغتسل).

**پ١٢/من ( ٥٠ ) مسقاڵ زێڕم هەیە و بەکاریشی دێنم، ئایا زەکاتی لێ دەکەوێ؟**

وەلام/ئەمە لەشەرعدا پێی دەگوترێ (زەکاتی حولی)، حولی ئەو زێڕەیە ئافرەت خۆی پێدەرازێنێتەوە، بۆ زەکات دان لێی زانایان دوو ڕای جیاوازیان هەیە:

یەکەم: دەڵێن زەکاتی لێ ناکەوێ ئەوانیش ئیمامی مالیك و شافیعی و حەمبەلیە (رەحمەتی خوایان لێ بێ) بەبەڵگەی فەرمودەی

( لیس في الحلي زكاة) جا ج بەردەوام لەبەری بکات یان بەس لەکاتی بۆنەو ئاهەنگەکان لەبەری بکات.

دووەم: هەندێك لەزانایانی تر دەڵێن زەکاتی لیّ دەکەوێ لەوان حەنەفیەکان لەگەڵ سەعیدی کوڕی موسەییب و سعیدی کوڕی جبیر و ئیبراهیمی نەخەعی و عەتاء و الزهری و عبدالله ی کوڕی شەددادو سوفیانی ثوری...هەروەها زانایانی سەردەمیش لەگەڵ ئەم رایەی حەنیفەدان (خودا لەهەموویان رازی بێ) بەبەلگەی ئایەتی ﴿ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ التوبة: ٣٤ – ٣٥ لەگەڵ فەرمودەی ابوداود (صححه الالبانی) (رەحمەتی خولیان لیّ بێ) جارێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوو پارچە زیوی بەدەست دایکە عائیشە وە بینی (خوای گەورە لێی رازی بێ) گوتی ئەمانە چین گوتی خۆم پێ دەڕازێنمەوە بۆ تۆ، قال: أتؤدين زكاتهن، قالت: لا ، قال: هو حسبك من النار. هەروەها لەفەرمودەی تری ابو داود و النسائي کە (صححه الالباني)..ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوو کچی لەگەڵ دابوو کە دوو بازنەی گەورەی لەدەست بوو فەرمووی

(أتعطين زكاة هذا قالت لا) واته ئایا زەکاتی ئەمانە دەدەی گوتی نەخێر، گوتی ئایا ناترسیٚ لەوەی خوای گەورە لەڕۆژی دوایی دووبازنەی ئاگرین لەدەستی کچەکانت بکات،

**پ١٤/کوشتنی بە هەڵـە ( قتـل الخطـا ) دوومـانگ بـەڕۆژوو دەبیٚ لەسەر یەك، ئەی ئافرەت کە دەکەوێتە سووڕی مانگانە چۆن دەتـوانی ئەم مەرجە جێبەجیٚ بکات؟**

**وەلام/**دوومانگ لەسەر یەك ئەگەر عوزری شەرعی نـەبوو، عـوزریش دوو جۆرە:

یەکـەم: عـوزری شـەرعی بـۆ نموونـە هـاتنی رەمـەزان، جـەژن بەسـەرداهاتن، نـەخۆش کـەوتن، نـاو بـۆ حـەج دەرچـوون و هـەروەها سوڕی مانگانە...

جا بەر لەو عوزرانە چەند رۆژی گرتبوو دوای تێپەڕبوونی عوزرەکـە رۆژیەکانی تری کە ماون تەواو دەکات.

دووەم: عوزری ناشەرعی وەکو سەفەرە دەکات یان دەعوەتێك بـۆ برادەرەکانی ساز دەکات یان هەر بـۆ خۆشـی سـەفەرێکی ئـوردن یـان ئێران دەکات یان کـەمێك پەسیو یـان سـەر ئێشەیتی یـان ...ئەگـەر بەهۆی ئەم عوزرانە کەفارەتەکەی پچڕپچڕکرد ئـەوا هیچی بۆ هـەژمار نـاکریٚ و پێویستە لەسـەرەتاوە دەسـت پێبکاتـەوە دوومـانگی دیکـە

لەسەر یەك بگرێت، كەواتە ئافرەتیش ئەگەر كەوتە سەرە مانگ یان منداڵ بوون ئەوا عوزری شەرعیەو دوای پاك بونەوە تەواویان دەكات.

**پ١٥/جا ئەگەر لەكوشتنی بەهەڵە دووكەس یان زیاتری كوشت ئایا هەردوو مانگ بەرۆژوو دەبێ یان بۆ هەر كوژراوێك دوو مانگ؟**

وەڵام/دەبێ بۆ هەر كوژراوێك خوێن (دیە)ك بدات و دوو مانگیش بەرۆژوو بێ بۆ نمونە چوار كەسی كوشتبوو دەبێ خوێنی چوار كەس بدات و هەشت مانگیش بەرۆژوو بێ بەڵام زانایان دەفەرموون دەتوانێ لەنێوان تەواوبوونی دوو مانگێك پشووەكی كورت وەربگرێ و دەست پێ بكاتەوە بۆ دوومانگی داهاتوو.

هەروەها دەشفەرموون ئەگەر هیچ پێچەوانەی یاسایی نەبوو (موخالف) یاسا بڕیاری دا سەد سەدا بەریە بەرامبەرەكەی سەدا سەد موخالەفە ئەوا نەدیەو نەكەفالەتی دەكەوێتە سەر بەڵام ئەگەر سەدا بیست (٢٠٪) یان سەدا پەنجا (٥٠٪) یان... موخالف بوو ئەوا دیەو كەفالەتی دەكەوێتە سەر.

<u>تێبینی:</u>

(١) یەك دیە سەد حوشترە .

(٢)ئەوەی ئەم قەتلەی لەدەست روویدات كۆكردنەوەی خوێنەكە لەسەر عاقیلەیە واتە (باب، مام، باپیر، برا، كوڕی برا، ...).

**پ١٦/ ئەگەر یەکێك ئاژەڵێکی سەربڕی لەبیری کرد بڵێ (بسم الله والله أکبر) ئایا ئەم گۆشتە حەرامە یان حەلاڵە؟**

وەلام/زانایان سێ رایان هەیە لەوتنی ناوی خوا لەسەر کوژراوەکە مادەم موسڵمانە:

أ-حەلالە (عمداً أو سهواً )نەیکات ، واتە گۆشتەکە حەلالە ئەگەر بە ئەنقەست یان بەلەبیر چوون ناوی خوای نەهێنا

ب-حەرامە (عمدا أو سهوا ) نەیکات، واتە گۆشتەکە خواردنی حەرامە چ بە ئەنقەست چ بەلەبیرکردن ناوی خوای نەهێنابوو لەکاتی سەربڕین.

ج-حەرامە (عمداً) نەیکات و حەلالە (سهواً) نەیکات ، واتە گۆشتەکە حەرامە ئەگەر بە ئەنقەست ناوی خوای لەسەر نەهیناو حەلالە ئەگەر لەبیری کرد، کە ئەمە رای بەهێزو وەرگیراوە.

کەواتە ئەگەر مریشك فرۆش لەرۆژێکدا (٥٠) مریشکی سەربڕی (بسم الله)ی لەبیرکرد ئەوا ئاساییە و هەمووی حەلالە بەلام لەبیرمە و نایکەم ئەوا گۆشتەکە حەرام دەبێ.

**پ١٧/ئەگەر غازات – هواء- لە پێشەوەی ئافرەت بێتە دەرێ ئایا دەست نوێژ دەشكێنێ؟**

**وەلام**/زانایان دوو رایان هەیە:

یەكەم: ئیمامی شافیعی وأحمد (رەحمەتی خوایان لێ بێ) دەست نوێژ دەشكێنێ.

دووەم/ئیمامی أبوحەنیفەو مالیك (رەحمەتی خوایان لێ بێ) دەڵێن دەست نوێژ ناشكێنێ.

رای بەهێز و وەرگیراو ئەوەیە كە دەست نوێژ ناشكێنێ هەروەكو لیجنەی دائیمەش و ابن عثیمین (رەحمەتی خوایان لێ بێ) ئەم رایەیان پەسەند كرد.

**پ١٨/ئایا دەتوانی خزم و كەسی بكوژ لەجێگای بكوژەكە بكوژیەوە وەكو (باب- برا – كوڕ – ئامۆزا –زاوا...)؟**

**وەلام**/نەخێر بە هیچ جۆرێك دروست نیە و حەرامە كوشتنی خزم و كەس لەجیاتی بكوژ (قاتل) ئەگەر وات كرد تۆش دەبیە قاتل و قەتلی عەمدیشە دەبێت بكوژرێیەوە بە ئەمری قازی و حاكیمی شەرعی.

**پ١٩/یەكێك دەڵێ شەو حەزم لێیە بۆ شەو نوێژ هەڵسم بەلام ئاوێرم لەتاریكیان؟**

**وەلام**/ئاساییەو دەتوانی لەجێگای خۆت زیکرو دوعا بکەی کە بێ دەست نوێژیش دروستن، مادەم نیەتی نوێژیشی هەیە بۆت دەنوسرێت، بەلام هەوڵ بدە ئەم ترسە لابدەو دڵی خۆت بە هێز بکە.

**پ٢٠/سوجدەی شوکر سەلام دانەوەی تێدایە یان نا؟**

و/کاتێك خۆشیەك یان هەواڵێکی خۆش روو تێدەکات ئەو کاتە وەکو سوپاس دەبڕین بۆ خوا ئەم سوجدە شوکرە دەبات و بەلای ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خوای لێ بێ) سەلام دانەوەی تێدایە بەلام بەلای زۆریەی زانایان سەلام دانەوەی تێدا نیە و تەکبیرەی دابەستانیشی ناوێ و هەروەها دەست نوێژیشی ناوێ و یەك سوجدەشە، سوجدەی قورئان خوێندنیش (سجدة التلاوة) هەمان حوکمی سوجدەی شوکری هەیە.

**پ٢١/ئەو فەمودەیەی کە دەفەرموێت نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات دابنیشێ تاوەکو رۆژهەلات دوو رکەعات چێشتەنگاو بکات بۆی بە حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواو دەنوسرێ، ئایا ئەگەر لەماڵیش دابنیشێ و وای کرد هەمان پاداشتی هەیە؟**

**وەلام**/زانایان دەفەرموون ئەگەر کەسێك بەهۆی نەخۆشیەکەوە یان عوزرێکی شەرعی تر چەند عیبادەتێکی لەدەست دا ئەوا خوای گەورە هەموو عیبادەتەکانی بۆ دەنوسێ هەروەکو لەکاتی لەش ساغیدا ئەنجامی دەدا ، چونکە عوزرێك و بەربەستێك هاتوەو رێی لێگرتوە بۆ

ئەنجامدانی ئەم عیبادەتە، کەواتە بە هەمان شێوە ئەو کەسەش دەرگای مزگەوتی لێ دادەخەن لەماڵ دادەنیشێ هەمان ئەجرو پاداشتی بۆ هەیە بەڵکو زانایان دەفەرمون ئەگەر هاتەوە لێی پاڵداوە هەر بۆی دەنوسرێ چونکە لەکاتی ئاسایی ئەو دادەنیشت و ئێستاش رێگرێك لێناگەرێ ئەم کارە ئەنجام بدات.

هەروەکو لەفەرمودەی صحیح داهاتوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ یەکێك لەغەزەواتەکان دەرچوو فەرمووی ئێستا هەندێك پیاو لەمەدینە بەجێ ماون و لەگەڵ ئێوە دانین و بەشداریشن لەپاداشتەکەتان چونکە (حبسهم العُذرُ- المرض) عوزرو نەخۆشی رێگریان بووە.

**پ٢٢/ئایا نوێژی عەسر لەگەڵ جومعە کۆ( جمع ) دەکرێ؟**

**وەڵام**/زانایان راجیاوازن هەندێك دەڵێن دەکرێ، هەندێکیش دەڵێن ناکرێ، بەڵام رای بەهێز ئەوەیە کۆدەکرێنەوەو جمع دەکرێن هەروەکو شێخ (العثیمین - رەحمەتی خوای لێ بێ) ئەم رایەی پەسەند کردووە.

**پ٢٣/برۆ کردن حەرامە بەڵام ئەگەر برۆیەك زۆر ناشیرین بێت و گەورە و تێکەڵ بوو دروستە رێکی بخەی؟**

**وەڵام**/ئەگەر بەم شێوەیە تێکەڵ و ناشرین بوو کە ئەمەش زۆر دەگمەنە ئەوا رێگە پێدراوە بە مقەس کەمێك رێکی بخەی، بەڵام

هەڵگرتنی بە تەواوی و دروست کردنی بەقەڵەم بەهەموو شێوەیەك حەرامە و بگرە نەفرین (لەعنەت) بەشی لەسەرە ئەوەی بۆی هەڵدەگیرێ و ئەوەش بۆی هەڵدەگرێ (وەستاكە).

**پ٢٤/ئەگەر منداڵ میزی بە مافور (فەرش) دا كرد، چۆن پاك دەكرێتەوە؟**

وەڵام/زانایان لەوان (ابن العثیمین- رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرمووێت دوو جۆر شوشتن و پاك كردنەوە هەیە:

یەكەم: ئەوانەی بچوكن دەتوانرێ بكوشرێ وەكو جلك ئەوا بشۆرێ و پاشان بكوشرێ تا ئاوەكە دەچۆڕێتەوە.

دووەم: ئەوانەی ناتوانرێ بكوشرێ وەكو مافورو كومبارو لێفەو قەنەفە و ...دووجار یان سێ جار بەرداخە ئاوێكی بەسەر دادەكەیو وشكی دەكەیەوە بە ئیسفەنج یان پەڕۆكێك تا شوێنەواری نامینێ ئیتر ئەمە پاك بویەوە.

**پ٢٥/حوكمی سوترە لەنوێژدا چیە؟ ئایا خەتی بەرماڵ دەبێتە سوترە؟**

وەڵام/لەنێوان زانایان را جیاوازی لەبارەی حوكمەكەی هەیە، هەندێك دەڵێن واجیبە هەندێكی تر پێیان سونەتی موئەكەدە هەندێكی تر پێیان سونەتە، جا رای بە هێز سونەتی موئەكەدەیە، هەروەكو

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (إذا صلى أحدكم فليصل إلى السترە وليدنو منها ) رواه أبو داود- صحيح.

جا سوترە پێویستە بە قەد بستێك بەرز بێت ئەگەر هیچت دەست نەکەوت خەتی بەرماڵەکە یان خەتی فەرشی مزگەوتەکە دەبێتە سوترە هەروەکو لەفیقهی (ابن فوزان-رەحمەتی خوای لێ بێ)دا هاتوە.

## پ٢٦/نەشتەرگەری جوانکاری ( عمليات التجميل ) دروستە؟

وەڵام/دوو جۆر جوانکاری هەیە:

یەکەم: هەیە لوتی خوارە یان چاوی خوارە یان ددانی شاشێکی ناشرینە یان لێوی شەقە...ئەمەیان دروستە نەشتەرگەری ئەنجامبدات و خۆی رێك بکاتەوە بۆ سەر شێوە ئاسایەکەی.

دووەم: نەشتەرگەریەکی تر هەیە پێی دەگوترێ (تحسينيه) وەکو لوت بچوککردنەوە یان لۆچ لابردنی دەم وچاو بەنیازی گەنج بونەوە یان سینگی گەورە و بچوك دەکات یان رومەتی بەرزدەکات یان ددانی بۆشایی تێدەخات.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: شەیتان ئەمرتان پێ دەکات گۆرانکاری (تغيير) لەخەلقی خوای گەورە بکەن.

کەواتە ئەم جۆرەیان جائیز نیەو حەرامەو پێ گوناهبار دەبێ.

**پ٢٧ بەکارهێنانی تۆقە بۆ قژی ئافرەتان دروستە یان نا؟**

**وەڵام**/ئەگەر تۆقەکە بچوك بێت بۆ ڕێکخستنی قژەکە بێ دروستە بەڵام ئەگەر بۆ سەر بڵند کردن بێت و سەربکاتە دوو سەر جا بەهۆی تۆقە یان پەڕۆك یان قژی خۆشی بێت با لەژێر چەفیەو عەباش بێت دروست نیە هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داهاتووە ئەو ئافرەتانە ناچنە بەهەشت و بۆنی بەهەشتیش ناکەن کە جلیان لەبەرەو روتیشن وە (رؤوسهن کأسنمة البخت المائلة ) واتە سەریان وەکو کۆپالەی پشتی حوشتر لێکردووە.

**پ٢٨/ئایا ئافرەتان لەشاشەکان سەیری وتاری مامۆستا یان پیاو دەکەن ئەزمرە یان نا؟**

**وەڵام**/بێگومان بۆ هەردوو رەگەز سەیرکردنی بێگانە ئەزەرە و تاوانە بەڵام زانایان دەفەرمون ئەگەر ئافرەت سەیری مامۆستای پیاوی کرد بە نیەتی زانست و تەقوا دوور لەشەهوەت و ئارەزوو ئەوا ڕێگە پێدراوە بەبەڵگەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دایکە عائیشەی (خوای لێ رازی بێ) لەپەنهانی دانابوو بۆ سەیرکردنی شەڕە شیری هاوەڵە حەبەشیەکان.

بەڵام دەبێ ئاگادار بین بۆ پیاو ڕێگە نەدراوە سەیری ئافرەتی بێگانە بکات هەروەکو لەسورەتی النور بەدرێژی هاتوە.

## پ٢٩ دوعا كردن به كوردی لەناو نوێژ دروستە یان دروست نیە ؟

وەڵام/شێخ الاسلام (ابن تیمیە – رەحمەتی خوای لێ بێ) لە (مجموع الفتاوی – ج ٢٢ – ل٤٨٨-٤٨٩)دا دەفەرموێ: بۆ ئەو کەسەی کە زمانی عەرەبی دەزانێ حەرامەو جائیز نیە لەسوجدەدا جگە لەزمانی عەرەبی دوعا بکەو بپارێتەوە بەڵام ئەو کەسەی کە زمانی عەرەبی نازانێ دروستە بە زمانی خۆی (تورکی – فارسی – کوردی – هەر زمانێکی تر) دوعا بکاو لەسوجدەدا بپارێتەوە کەواتە ئەوەی عەرەبی دەزانێ و بەکوردی بخوێنێ نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت.

هەندێکی تریش لەزانایان دەفەرمون ئەم دوعاکردنە بە کوردی لەناو نویژدا بۆ ئەو کەسەی عەرەبی نازانێ تەنها بۆ نوێژی سونەتە.

## پ٣٠/چۆنیەتی نوێژکردنی ئافرەت لەنەخۆشخانەو قەرەباڵغیدا؟

وەڵام/ئەگەر بێگومان بوو لەو شوێنەی کەوا دەچێتێ (نەخۆشخانە – بازار– ...) شوێنی نوێژکردن هەیەو بێ کێشەیە و تایبەتە بە ئافرەتان ئەوا لەوێ نوێژەکەی خۆی ئاسایی دەکات، بەڵام ئەگەر دڵنیا نەبوو لەم شوێنەی کەوا دەچێتێ ئەوا با لەماڵەوە نوێژەکانی کۆبکاتەوە (جمع و تقدیم) ئینجا بەبێ خەم دەربچێت.

بەڵام ئەگەر نەیکردو دووچاری شوێنی قەرەباڵغ بوو ئەوا دەبێ پەنایەك بدۆزێتەوە یان ژنێکی تر پەنای لێبکات تاکو لەبەر چاوی پیاوان ون بێت و ئینجا نوێژەکەی ئەنجام بدات .

بزانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )کەوا نوێژی (نیوەڕۆ عەسر)و (مەغریب و عیشا)ی کۆکردیتەوە بێ ئەوەی عوزرو سەفەرو بارانیش بێ تۆش دەتوانی جار جار کۆیان بکەیەوە لەگەڵ ئەوەشدا دەرچوونت بۆ نەخۆشخانەو بازار و قەرەباڵغی عوزری شەرعیە.

## پ٣١/مەودای کورت کردنەوە ( قەصر ) بۆ نوێژ چەندە؟

وەڵام/جمهوری زانایان ڕێگایان داوە لە(١٦) فەرسەخ بێ کەواتە دەکاتە (٤٨) میل ، هەر میلێکیش(١٢٠٠) پێیە کە دەکاتە (٨٣) کیلۆمەتر، إبن قودامە لەموغنیدا دەفەرموێ لەمەزهەبی أحمدی کوڕی حەنبەل جائیز نیە لە(١٦) فەرسەخی کەمتر بێ، هەروەها لەمەزهەبی شافیعیشدا هەروایە (١٦) فەرسەخ واتە (٨٣) کم کە دەکاتە دوو ڕۆژ بە پێ ڕۆیشتن، ئەمە وتەی إبن عباس و إبن عمریشە، هەروەها رای ئیمام مالیکیشە کەواتە جمهور لەسەر ئەوەن ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ.

رای دووەمیش ئەوەیە دەڵێن مەودایەکە دیاری نەکراوە بەڵکو دەگەڕێتەوە سەر داب و نەریتی خەڵکەکە ئەگەر ئەم دەرچوونەیان بەسەفەر زانی ئەوا جائیزە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە وە ئەگەر (٢٠)کم یش بێت.

ئەمەش رای شیخ الاسلام ابن تيميه و ابن القيم ( ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) کەواتە ئەگەر دەرچوونێك بەسەفەر دانەنرا با (١٠٠) کم

نوبی ئەوا دروستنیە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیەیە کە لەصحیح مسلم دا هاتوە کە ئەنەسی کوڕی مالیك (خودا لەتێکڕای زانایانی ناومان هێنا رازی بێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا خرج مسيرة ثلاثة أميال أو ثلاثة فراسخ صلى ركعتين) رواة مسلم.

کەواتە سێ فەرسەخ یەکسانە بە (١٥) کم و نیو لیترە زانایان دەفەرمون لەسنوری شارەوانیەکەی خۆت دەرچوی دەتوانی دوای ئەم سێ فەرسەخە نوێژەکانی قەصرو جەمع بکات.

## پ٣٢/کڕین و فرۆشتنی ئەو کاڵایانەی وێنەیان لەسەرە دروستە؟

و/ئەگەر ئەو کەل وپەلانە وێنەی ئافرەتی لەسەر بێ کە لێننەیە بۆ پیاوان و هەروەها بە پێچەوانەشەوە بەتایبەتی لەسەر شامپۆو سابون، هەتا هەندێ جار لەسەر گێسك و پەرداخ و ئامێرە ئەلیکترۆنیەکانیان داناوە وەلامی زانایان ئەوەیە کڕین و فرۆشتنی دروستە بەلام تا بکرێت خۆت لەم وێنە ناشەرعیانە بپارێزەو وێنەکان بسڕیەوەو لایان بدەی چونکە لەفەرمودەی صحیح دا هاتوە مەلائیکەت ناچێتە ئوێنێك کە ئەم وێنانەی لێبێ.

تێبینیشمان بۆ ئەو برا موسڵمانانە هەیە کە دوکانی کەمالیاتی ئافرەتانیان هەیە خۆیان بپارێزن لەو هەموو وێنەی رووت و بەرەڵایە

لەسەر ئەم کالآیانە تاوەکو جلی ژێرەوەش. جا بەڕاستی ئەم کاسبیە لەگەڵ پیاوی موسڵمان ناگونجێ و پێویستە خۆیان لێ وەدوور بگرن.

**پ٣٣/ ئایا دەتوانی لەزیکرەکانی پاش نوێژ لەجیاتی (٣٣) جار بڵێی سبحان الله بڵێی سبحان الله العظیم، لەجیاتی الحمد لله بڵێی الحمد لله رب العالمین؟**

**وەڵام**/زانایان دەفەرموون ئەگەر بە رەها(مطلق)ی خوێندت ئەوا بە درێژی بیان لێ پاداشتی زۆرترە مادام هەروا بۆخۆت دەیانخوێنێت، بەلآم ئەگەر بەسترایەوە(مقید) بوو واتە ئەم زیکرە تایبەت بوو بەکارێك ئەوا دروست نیە زیادو کەمی تێبخەی بەڵکو چۆن هاتوە لەشەرع بەم شێوەیە دەیخوێنی، کەواتە زیادەکە دەبێتە بیدعە و تاوانبار دەبی بۆ نمونە کارەکە نوێژە ، زیکرە تایبەتەکەشی وتنی (٣٣) جار (سبحان الله، الحمد لله، الله اکبر) نابێ هیچ زیادەیەکی بۆ بکەی مادام بەم شێوەیە لەشەرعدا هاتووە نمونەیەکی تریش (الحمد لله)ی پژمین نابێت بڵێی (الحمد لله رب العالمین) یان (بسم الله) نان خواردن نابێت بڵێی (بسم الله الرحمن الرحیم) چونکە ئەمانە عیبادەتن و عیبادەتیش وەقفەو چۆن لەشەرع هاتووە ئێمەش دەبێ وابکەین..

**پ٢٤/ئایا هەڵواسینی وێنە دروستە، جل وبەرگی منداڵان وێنەی تێدابێ، گەمانی منداڵان (لعابە) لەسەر شێوەی گیانلەبەر دروست کراوە بەکارهێنانی دروستە؟**

**وەڵام/**پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێ: ﴿ أشدُّ الناس عذابا يوم القيامة المُصوِرون﴾ هەروەها دەشفەرموێ : (أصحاب هذه الصور يُعذبون يوم القيامة يُقال أحيوا ما خلقتم).

کەواتە زانایان بە پێی ئەم بەڵگانە دەفەرموون وێنە کێشان و وێنەگرتن و وێنە هەڵواسینی گیان لەبەران حەرامن.

بۆیە شێخ عثیمین (رەحمەتی خوای لێ بێ) لەوەڵامی پرسیارێکدا فەرموی حەرامە وێنەی گیانلەبەران بە جلکی منداڵەوە بێ، بەڵام زانایان (رەحمەتی خوایان لێ بێ) لەبارەی (لعابە) دەفەرمون هیچی تێدا نیە چونکە دەکەوێتە سەر زەوی و بن دەست و پێی منداڵان.

چارەسەری ئەم جلکانەی کەوا وێنەیان تێدایە فرێی مەدە بەڵکو وێنەکە تێکبدە بەدەرزی و داو یان لەزگە یان هەڵوەشاندن یان ...

لەو فەرمودەش کەهاتوە مەلائیکەت ناچنەماڵێك کە سەگ و وێنەی تێدا بێت زانایان دەفەرمون لەفەرمودەکە دیاری نەکراوە کە وێنە کێشان بە دەست بێت یان بەگرتن و دروست کردنی بێ کەواتە وێنە بە هەموو جۆرێك حەرامە بە تایبەتی هەڵواسینی، دوو جۆریشیان

ڕێگە پێدراوە یەکێکیان وێنەی مرعامەلات و دووەمیان وێنەی ڤیدیۆیەکان بۆ وتاری ئاینی.

## پ٢٥/ئایا دروستە نەچمە مزگەوت و بۆ نوێژ فێرکردنی منداڵەکانم لەماڵەوە لەگەڵیان بە جەماعەت بکەم؟

وەڵام/بەهیچ جۆرێك دروست نیە بەو بەهانەیە نەچیە مزگەوت مادام مزگەوتەکەو ئیمامەکە نوێژیان دروست بێت، کوڕەکان لەگەڵ خۆت ببە مزگەوت و دایکەکەش لەگەڵ کچەکان لەماڵەوە بە کۆمەڵ نوێژ بکەن، چونکە لەفەرمودەدا هاتوە (لا صلاة لجار المسجد).

ابن حزم و ظاهریەکان (رەحمەتی خوایان لێ بێ) دەفەرمون بە هیچ جۆرێك نوێژی دراوسێی مزگەوت لەماڵ دروست نیە وەکو ئەوەیە کە نوێژی نەکردبێت، بەڵام زانایانی تر دەفەرمون نوێژەکەی دروستە بەڵام تاوانبارە.

جا بۆ فێربونی منداڵەکان زانایان دەفەرمون دەتوانی نوێژە سونەتەکانی مزگەوت بهێنێتەوە ماڵ و بە جەماعەت ئیمامەتی بۆ منداڵەکان بکات، یان دەتوانی ئەم نوێژە فەرزەی لەمزگەوت ئەنجامی داوە هەمان نوێژ لەماڵەوە بەجەماعەت ئەنجامی بداتەوە هەروەکو لەفەرمودەی معاذی کوڕی جەبەل هات (خوای لێ ڕازی بێ ) کە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نوێژی فەرزی ئەنجامدەداو بەپەلە دەچۆوە ناو قەومەکەی پێش نوێژی فەرزەکەی بۆ ئەنجام دەدانەوە،

بۆ موعاز بە سونەت دەنوسراو خەڵکەکەش جەماعەتیان بۆ هەژمار دەکرا.

## پ٣٦/چۆنیەتی سەلام کردن و وەڵامدانەوەی نێوان ژن و پیاوی بێگانە؟

وەڵام/ئیمامی نەوەوی (خوای لێ رازی بێ) دەفەرموێت سەلام کردن لەئافرەتی مەحرەم (دایك – پلك – خوشك...) واجیبە.

ئیمامی مالیك دەفەرموێت سەلام کردن لەئافرەتی بێگانە دەکرێ ئەگەر پیربوو بەڵام ئەگەر گەنج بوو جائیز نیە و ناکرێ، هەروەها ئیمامی زەرقانی لەشەرحی ئەو فەرمودەی کە لەموطأ ی ئیمامی مالیك داهاتوە دەڵێت جائیز نیە سەلام لەئافرەتی گەنج بکرێ ، ئیمامی أحمدیش بەهەمان شێوە ئەمە رەئیەتی هەروەها ئیمامی نەوەوی (خوا لەهەمویان رازی بێ) لە(أذکار)دا دەفەرموێت زانایانی شافیعی موتەفیقن کە سەلام لەپیر دەکرێ بەڵام ئافرەتێك گەنج بێ یان بەرچاو بێ مەترسی فیتنەی لێ بکرێ ئەگەریش پیربێ سەلامی لێ ناکرێ ئەگەر پیاوان سەلامیان لەم جۆرە ئافرەتانە کرد ئەوا واجیبە ئافرەتان وەڵامیان بدەنەوە بەڵام لەدڵی خۆیان بە بێ دەنگی.

## پ٣٧/ئەگەر کەسێك قوڵوڵنی هەبێ و پیخ و قوزە قوز بەناو زگی دابێ و دەرنەچێ، ئایا دەست نوێژ دەشکێنێ؟

وەڵام/نەخێر ناشکێنێ مادام دەرنەچێتە دەرەوە.

**پ٢٨/حوكمی حەلقە چیە کە لەعەرەبیدا دوبلەی پێ دەگوترێ کاتێک بوک و زاوا دەیگۆڕنەوە؟**

وەڵام/زانایان (الالبانی،ابن العثیمین، ابن باز) دەفەرمون حەرامە، شێخ الالبانی دەفەرموێ ئەمە عادەتێکی خاچ پەرستەکان (نەسرانیەکان)ە بەر لەهەزار ساڵ لەمەو پێش هەبووەو هەندێک دەڵێن هی سەردەمی فیرعەونەکانە و هەندێکیش دەڵێن هی سەردەمی ئەغریقیەکانە کەواتە چاو لێکردنی جولەکەو خاچ پەرستەکان جائیز نیە و حەرامە، بەڵام ئەگەر بە هۆی ئەو بۆنەیە نەبێ لەدەست کردنی دروستە و هیچی تێدا نیە، بەتایبەتیش ئەنگوستیلە لەپەنجە کردن سونەتی پێغەمبەرە(صلی الله علیە وسلم) هەروەکو لەفەرمودەی صحیح دا هاتوە .

**پ٢٩/حوکمی دیتنەوەی زێڕو زیو یانماڵی بزربوو چیە؟**

وەڵام/ماڵی بزربوو لەسێ باردا بەدەر نیە:

یەکەم: دارێکە، قامچیەکە، گۆپارێکە واتە شتێکی کەم نرخ و سادە بۆ خۆی دەبات مادام خاوەنەکەی بەدەر نەکەوت هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)دا هاتوە (رخص رسول الله صلی الله علیە وسلم في العصاء والسوط والحبل یلتقیە الرجل ) رواه ابو داود.

دووەم: شتێکە دەتوانی پارێزگاری لەخۆی بکات وەکو (حوشتر و چێلّ و ئەسپ) ئەوا لێی دەگەڕێی تاوەکو خاوەنەکەی خۆی دەی دۆزێتەوە هەروەکو کەسێك حوشترێکی دیتەوە هاتە لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی تۆ ﷺ کارێکت لەحوشترە ئاوی خۆی و خواردنی خۆی پێیە بەواتای لێیگەڕێ تاوەکو خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە بەواتای تۆ بۆت نیە بیگریەوە.

سێیەم: ئەگەر پارەو زێڕو کالا بوو، دەبێت ئاگاداری بۆ بلاوبکرێتەوە و تا ساڵێك دایبنێ پاش ئەو ساڵە خاوەنەکەی هەر نەبوو دەبێتە ماڵی خۆت، مریشك و مەڕو بزنیش دەچێتە ژێر ئەم بارەیەوە بەلام ئەگەر شتێك مانەوەی کورت بوو وەکو سندوقی میوەجاتێك دەتوانی پاش ئاگادارکردنەوەی بەکاری بێنی و لەماوەی ئەم ساڵەدا ئەگەر خاوەنی پەیدابوو ئەوا دەیفرۆشێ و نرخەکەی دەدەیەوە خاوەنەکەی.

**پ٥٠/ئەگەر کەسێك غوسلی کرد دەتوانێ پاش غوسلەکە دەست نوێژ بشواتەوە؟**

وەلام/ئەگەر نیەتی هەبوو بۆ دەست نوێژیش ئەوا پێویست ناکات دوای غوسل دەست نوێژ بشواتەوە چونکە غوسل دەست نوێژ.

**پ٤١/ناتوانم بە دەستی ڕاست بخۆم و بخۆمەوە چونکە چەپانم و ئایا چیبکەم؟**

**وەڵام/**لەفەرمودەی صحیح دا هاتوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕاستەی خۆش ویستوە و بۆ شتە چاکەکانی بەکارهێناوە وەکو خواردن و خواردنەوە...بەڵام بۆ پاك کردنەوە چەپەی بەکارهێناوە، جا لەسەدان بەڵگە سەلمێنراوە مرۆڤی چەپان دەتوانی خۆی ڕابێنێ بەراستە بخواو بخواتەوە...

یەکێك لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نانی خوارد بەچەپە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی وت بەراست بخۆ وتی ناتوانم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموی (لا استطعت) واتە قەت نەتوانی، تا مرد نەیتوانی دەستی ڕاستی بۆ دەمی بەرز بکاتەوە، کەواتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) توڕە بوو بەوەی پێچەوانەی سوننەت دەکات لەکاتێکدا دەتوانی خۆی بگۆڕی و ناشیگۆڕی.

**پ٤٢/لەکاتی کۆکردنەوەی ( جمع ) کردنی دوو نوێژدا سوننەت و زیکرەکان چۆن دەکرێ؟**

**وەڵام/**ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ پاش جمع کردنی دوو نوێژەکە سوننەتەکان ئەنجام دەدرێ بۆ نمونە مەغریب و عیشای جمع کرد ئەوا پاشان دوو رکعەتی سوننەتی مەغریب دەکا ئینجا دوو رکعەت سوننەتی عیشا و دوایی وترەکە

دەکات، لەبارەی ویردەکانیش (أذكار) شێخ ابن العثيمين (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ ئەزکاری کام نوێژ درێژتر بێ ئەمیان دەخوێنێ لەجێگای هەردوکیان ، هەروەها ابن قدامەش لەموغنیدا وای فەرموە.

**پ٤٣/ئافرەتێک دەڵێ لەماڵی پیاوەکەم بۆ خۆم هەندێ پارە پاشەکەوت دەکەم ئایا دەتوانم بەبێ مۆڵەتی پیاوەکەم خەرجی بکەم؟**

وەڵام/ئەگەر هاتوو بەبێ مۆڵەتی پیاوەکەی پارەکەی پاشەکەوت کردبێ ناشکرێ بەبێ مۆڵەتی ئەو خەرجی بکات بەڵام ئەگەرپیاوەکەی پێیگوتبێ ئەم پارەیە بۆ خۆت پاشەکەوت بکە ئەو کاتە مادام گوتی بۆ خۆت ئەوا مۆڵەت دراوە ئەم ئافرەتە بە ئارەزوی خۆی هەڵس و کەوت لەگەڵ ئەم پارەدا بکات چۆنی بەکاری بێنێ دروستە.

**پ٤٤/دەڵێ من موسڵمانم و حیجاب ناکەم، چونکە عادەتی عارەب و کۆنە؟**

وەڵام/بۆ نمونە تۆ تەقدیمی زانکۆیەک یان فەرمانگەیەک دەکەی بۆ وەرگرتن لەم شوێنەدا، بەڕێوەبەرایەتی زانکۆ دەڵێ ئەوە مەرجی وەرگرتنمانە، تۆ بڵێ هەندێکم بە دڵەو هەندێکم بە دڵ نیە، بەڕێوەبەرکە دەڵێ برۆ با باوکت زانکۆیەکی ترت بۆ بدۆزێتەوە، دەی باشە بڵێی نوێژم بە دڵەو رۆژوم بە دڵە و بەس حیجاب نا ، با بزانین

خـوای گـەورە چـۆنت وەلام دەداتـەوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێ:

﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ﴾ البقرة: ٨٥

واتا:باوەڕ بە هەندێك لە كیتاب دەكەن و و كوفر بە هەندێكی تـر دەكەن.

ئەوەش بزانە كە حیجاب واجیبە هەروەكو چۆن نوێژو ڕۆژوش واجبە، خوای گەورە دەفەرموێ: الاحزاب :٥٩﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٥٩.

(جلابيبهن) واتە چوار گۆشەكانیان هەمو لاشەیان دابپۆشێ.

هەندێك جاریش هەیە ئافرەتی موحەجەبە باوەڕیان بەنوێژو ڕۆژو حیجاب هەیە بەلام نارازیە بەرامبەر ئایەتی فرە ژنی (تعدد الزوجات) ڕەت دەكاتەوە هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَـٰثَ وَرُبَـٰعَ ﴾ النساء: ٣

هەمان حوكمی پێشوی هەیە.

**پ٤٥/نوێژ نەکەر (تارك الصلاة) دەڵێ باوەڕم پێ هەیە بەس لەبەر تەمبەڵی نایکەم؟**

وەڵام/تەمبەڵێ ڕۆژێك دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ ناکرێ مانگێك و شەش مانگ و ساڵێك بۆ نمونە تۆ قوتابی لەقوتابخانە شەش مانگ نەچیە قوتابخانە لەبەر تەمبەڵێ و بڵێی تاقەتم نیە، ئایا بەڕێوەبەر فەصلت ناکا و دەرت ناکات؟ کەواتە تۆ لەقوتابیاتی نەماری.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ۝٥ ﴾ الماعون: ٤ – ٥

عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێت ئەوانەن نێوەڕۆ دوا دەخەن بۆ نزیك عەسر و عەسر دوادەخەن بۆ نزیك مەغریب و ... ئەمانە ساهونە و سوکایەتی و تەمبەڵی کردنە لە نوێژدا کە سزای واسەختی وایان بۆهەیە لەدۆزەخ ئەی دەبێ سزای نوێژنەکەر (تارك الصلاة) چی بێ؟!!!

**پ٤٦/ئافرەتێك دەڵێ دەتوانم لەماڵەوە زیکر بکەم بەسەر کۆتی؟**

وەڵام/هیچی تێدا نیە مادام لەماڵی خۆیەتی و پیاوانی بێگانە نایبینن، بەڵکو زانایان دەفەرمون لەم بارەدا دەتوانێ قورئانیش بخوێنێ بەسەر کۆتی و قۆڵ و باسکیشی بەدەرەوە بێ.

**پ٤٧/جائیزەبۆ ئیمامی (عەلی کوڕی باوکی تالیب – خـوای لـێ ڕازی بێ) بڵێی (کرم الله وجهه)؟**

و/دروست نیە و جائیز نیە چونکە خـوای گـەورە لـەقورئانی پـیرۆز دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ ﴾ التوبة: ١٠٠

جا پێویستە ئێمەش وەکو خوا فێری کردوین لەبارەی ئیمامی عەلی و ابوبکرو عومەر و عوسمان و هاوەڵانی تریش بڵێین (رضی الله عنهم) واتە خوا لێیان ڕازی بێت.

**پ٤٨/کل لەچاو کردن بۆ ئافرەتان دروستە یان نا؟**

وەڵام/زانایان دەفەرمون دروستە بە مـەرجێ بـۆ بەرچاوی پیـاوانی بێگانەی نەبێ چونکە تەبەروجەو حەرامە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:

﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ الأحزاب: ٣٣

کەواتە مادام بۆ ماڵ و پیـاوی خۆیـەتی ڕێگـە پێدراوەو هیـچی تیـا نیە، ئەگەر نیقابیش بـێ نـەك کل بـەڵکو مکیـاجیش دروسـتە چـونکە دەرناکەوێ و داپۆشراوە دەم و چاوی.

**پ٤٩/هەندێك دەڵێن سەیرکردنی ڕووی براژن (ژن برا) ڕێگە پێدراوە تا چەند ئەم قسەیە ڕاستە؟**

**وەڵام**/زانایان دەفەرمون ژنی برا وەکو هەموو ئافرەتانی بێگانە (نامەحرەم) جائیز نیە سەیرکردنی هەروەکو ژنی مام و ژنی خاڵ و کچی پورو کچی مام و ...هەمویان نامەحرەمن مادام مارەبیان لێت بێت کەواتە تەزەریان حەرامە، بەبەڵگەی چەندین ئایەت و فەرمودەی شیرین.

**پ٥٠/ئایا تەوقە (دەوقە) لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم ئەگەر قوماش یان دەستکێشی لەدەست بێ دروستە، ئایا حوکمی ئافرەتی پیر وەکو ئافرەتی گەنج وایە؟**

**وەڵام**/شێخ (ابن العثيمين – رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت دروست نیە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ وەکو قوماش و دەست کێشیش هەبێ دەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم بکرێ هەروەکو لەفەرمودەی صحیح دا هاتوە.

خوای گەورە لەقورئانیش دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الإسراء: ٣٢

جیاوازیش لەنێوان گەنج و پیردا نیە چونکە گەنج سنوری نیە لەوانەیە لای تۆ پیر بێ و لای من گەنج بێ.

**پ٥١/هەندێك ئافرەت لەكاتێك مێردەكەیان لەماڵ نیە لەو كاتە پیاوی بێگانە لەدەرگا دەدا ئەوانیش بە بیانوی ڕێز گرتن لەمیوان فەرمویان لێدەكەن و دەڵێن دانیشە چایەك بخۆ؟**

وەڵام/شێخ عبدالله بن جبرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: بەهیچ شێوەیەك دروست نیە فەرمو بكەی مادام پیاوەكەی لەماڵ نەبێ، نەوەك ئەم پیاوە بچێتە ژورەوە و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(لا یخلون رجل بامرأة إلا كان الشیطان ثالثهما ) .

هەروەها دەفەرموێ: (ایاكم والدخول علی النساء ، قالوا : یا رسول الله أرأیت الحمو؟قال الحمو الموت).

ئەگەر بۆ خزم و برای مێرد دروست نەبێ بچێتە ماڵ بەهیچ جۆرەك بۆ بێگانە هەر دروست نیە.

**پ٥٢/لەفەرمودەدا هاتوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەر پشتی حوشتر نوێژی سونەتی كردوە ئایا ئێمەش دەتوانین لەناو ئوتومبێل دا نوێژی سونەت ئەنجام بدەین؟**

وەڵام/بەڵێ دەتوانی لەناو ئوتومبێل نوێژی سونەت ئەنجام بدەی جا ئەگەر شوفێر بیت یان شوفێر نەبێ، ركوع و سوجدەكەش بە پێی توانا ئەگەر بۆینەكرا بەس بە ئاماژە ئەنجام بدات.

هەرچەندە شافعیەکان دەفەرمون پێویستە دەبێت سەرەتا رووت لەقیبلە بکەی پاشان لەکاتی رۆیشتن رووشی بگۆڕیٚ هەر تەواوە، بەلام زانایانی تر دەفەرمون سەرەتا روشت لەقیبلە نەبیٚ دروستە هەروەکو لەفەرمودەی صحیح دا هاتوە.

## پ٥٣/کوشتنی حەشەرات و مێرو و تەیرۆکە دروستە یان نا؟

وەلام/ئەگەر زەرەریان نەبو حەرامە کوشتنیان چونکە لەفەرمودەدا هاتوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کوشتنی ئەو پێنجەی واجیب کردووە ئەگەر لەئیحرامیشدا بووی (قەلە رەش – سەگی رەش – مشك – مار – دوپشك) جا زانایان قیاسیان کردووە هەرچیەك بوە مایەی زەرەر دەتوانی بیکوژی وەکو شارە مێرو یان سیسرکە یان ...

بەلام دەبیٚ ئاگادار بین سوتاندنیان بە ئاگر حەرامە هەروەکو لە (مصنف عبدالرزاق) دا هاتووە جا دەتوانی بە ئاو یان بە دەرمان یان بە بۆن لەناویان ببەی مادام زیانیان بۆت هەیە.

هەروەها ئەو صعقە کارەباییە وەکو دەسکە تێنسە بەکارهێنانی جائیزە بۆ کوشتنیان چونکە کارەباییە هەروەکو شێخ ابن العثیمین (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) فەتوای داوە.

## پ٥٤/هەڵواسینی مێرووی شین لەماڵدا بۆجوانی دروستە؟

وەلام/لەبنەڕەتدا دروستە بەلام چونکە کەسانێك بۆ چاوو زار بەکاری دەهێنن بۆیە هەڵواسینی دروست نیە و حەرامەو شیرکە

هەروەکو هەڵواسینی دەست کە وێنەی چاوێکی تێدایە یان ناڵی ئەسپ یان تاکە نەعل یان ...، هەڵواسین هەمور ئەوانە حەرامە چونکە شیرکی بچوکن

**پ٥٥/ئایـەتی ﴿لا إکـراه فی الـدین﴾ لەسـورەتی بەقـەرە کـە دەفەرموێ زۆری (تۆبزی) لەدین دا نیە، ئایـا مانـای وایـە کـە رێگـا بدات بە ئازادی بیروڕا و ئازادی دەربڕین و ئازادی لەمـشك پەرسـتن و چیلێ پەرستن و ...؟**

**وەڵام/**هەندێك لەزانایان – رەحمەتی خوایان لێ بێ – دەفـەرمون ئەم ئایەتە منسوخەو نەسخ بۆتەوە بە بەلگەی :

أ–لەدەوڵـەتی مەککـەو مەدینـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم نەیهێشت یەك موشریك و کافر دابنیشێ.

ب–بەبەلگەی ئایـەتی : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ التحریم: ٩

ج–بەبەلگـەی ئایـەتی : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ التوبە: ١٢٣

هەندێکی تریش دەفەرمون نەسخ نەبۆتەوە بەلام تەنها بۆ (اهل الکتاب)ە واتە جوو گاور ئەوان مادام سەرانە (جزیە) دەدەن و ملکەچن بۆ حوکمی شەرعی ئەوا زۆرلێکردن و تۆبزیان لێ ناکرێ دەست لەدینەکەی خۆیان هەلگرن.

هەروەکو لەتەفسیری (الطبري ) دا هاتوە و دەلێ ئەم ئایەتە تایبەتە بە خاوەن کتابەکان (جوو گاور) هەروەکو لە(ابن عباس و مجاهد و قتادەو...) دەگوازنەوە بۆ مان.

پاشان کاتێك سەیری جەنگی هەلگەڕاوەکان دەکەین (حرب الردة کە ابوبکر الصدیق) (رەزای خوای لێ بی) سازی کرد لەسەر ئەوە بوو زەکاتیان نەدا خۆ نوێژو ڕۆژوو حەجیشیان دەکرد بەلام ئایا ابوبکر گوتی دەی ﴿لا إكراه في الدين﴾ با تۆبزیان لێ نەکەین و ئازادن، نا نەخێر بەلکو جەنگی لەگەل ئەنجام دان تاکو مل کەچی شەرعیەتی کردن.

**الحمدُ لله رب العالمين ، والصلاةُ والسلامُ على خاتمِ الانبيـاءِ والمرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين**

**١- (الشيخ ابن العثيمين):-**

هەر شتێك رێگربێ لەگەیشتنی ئاو بەلەش دەبێ لابدرێ بۆ دەست نوێژو خۆشوشتن وەكو(بۆیاغو مێش و چەوری و...)

**(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)**

**٢- (الشيخ ابن جبرين):**

كەسێك پیسیەكی بینی بە جلەكەی لەكاتی نوێژدا، دەبێ نوێژەكەی ببڕێ و پیسیەكە بشوات و جارێكی تر سەر لەنوێ نوێژەكە بكاتەوە.

**(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)**

**٣-(الشيخ ابن باز):**

دەبێ دڵنیا بێ ئەگەر نا نوێژەكەی نابێ ببڕێ.

**(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)**

**٤-(الشيخ محمد بن ابراهيم):**

لیكە كراسی ئافرەت ئەگەر بەسەر پیسی دا تێپەڕێ وەكو حوكمی نەعلە كە پیس بوو پاشان بەسەر شوێنێكی پاكی ووشك دا رۆیشت ئەوا پاكی دەكاتەوە.

**(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)**

٥-(الشيخ ابن العثيمين):-

هاتنـه دەرەوەی بـا لەپێـشەوەی (فـرج)ی ئـافرەت دەسـت نوێـژ ناشکێنێ چونکە لەشوێنێکی پیس نایەتە دەرەوە.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٦-(الشيخ ابن فوزان):

دروست نیە ئافرەت جلکی رووت لەبەر بکات لەبەر دەم منداڵەکانی و مەحرەمـەکانی و نـابێ لاشـەی خـۆی دەربخـات تـەنها ئەوەنـدەی عادەتە و کەفیتنەی تێدا نیە بەڵکو جلی کـورت تـەنها لای پیاوەکـەی لەبەر دەکات.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٧-(الشيخ ابن باز):

نابێ واز لەنوێژ بهێنێ ئـەو دوو گیانـەی بـەردەوام بـە ئـازارە لـەمیز هاتنە خوارێ، بەڵکو وەکو خوێنـە چرکە (استحاضة) وایـە، بـۆ هـەر نوێژێك دەست نوێژ دەشوات و بەپێی توانا پارچە پەڕۆیـەك بـەخۆی هەڵدەگرێ.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٨-(الشيخ ابن العثيمين):

دروسـتە ئـافرەت منـداڵ هـەڵبگرێ لەنوێـژدا بەمـەرجێ خـاوێن بـێ و پێویست بکات ئەگەر هەڵینەگری لەنوێژەکەی بێ ئاگای بکات.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٩.(الشيخ ابن فوزان):

ئەگەر ئافرەت دەرچوو بۆ نوێژی تەراویح و بووە هۆی پەکخستنی کارەکانی ماڵەوەی با کەمیش بێ، نابێ دەربچێ چونکە کارەکانی ماڵەوە واجبە و چوونە مزگەوت ڕێ پێ دراوە(مباح).

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٠-(اللجنة الدائمة):

سوننەت نیە ئافرەت قامەت بکات بۆ نوێژ چ نوێژی تاك چ نوێژی کۆمەڵ، بەڵام باپێش نوێژی بکات بۆ ئافرەتان و نابێ بچێتە پێشەوە وەکو ئیمامی پیاوان بەڵکو لەناوەڕاستی ڕیزی یەکەم ڕادەوەستێ.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١١-(اللجنة الدائمة):

دروستە ئافرەتان بەشداری بکەن لەگەڵ پیاوان لەنوێژی مردوو، چونکە ئەصل لەعیبادات عامە بۆ پیاوو ئافرەت.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٢-(اللجنة الدائمة):

دروستە حەیز دار ئافرەتی مردوو بشوات و کفنیان بکات.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٣-(اللجنة الدائمة):

راستتر ئەوەیە کە سوجدەی خوێندنی قورئانو سوجدەی شوکر ج خوێنەر ج گوێگر مەرج نیە دەست نوێژی هەبێت با سوجدە بیات، چونکە سوجدە حوکمی نوێژی نیە.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٤-(الشيخ ابن جبرين):

دروستە حەیز دار نزاو پاڕانەوە بکات و بەڵکو سوننەتیشە زۆر پاڕانەوە بکات بە تایبەت لەکاتە پیرۆزەکان.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٥-(الشيخ ابن الجبرين):

دروست نیە ئاهەنگی بووك و زاوا لەناو ئافرەتان بکرێ چونکە ئەمە نەمانی شەرمە و چاولێکردنەوەی تاوانبارانە.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٦-(الشيخ ابن العثيمين) :

دروست نیە وێنەگرتن بە کامیراو ڤیدیۆ لەم ئاهەنگانەدا بێ گومان ئیماندار رازی نیە وێنەی ئافرەتەکانی خۆی ببێتە کاڵایەکو نیشانی هەموو کەس بدرێو فاسقەکان چێژی بینینی لێ وەربگرن.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٧ (الشيخ ابن فوزان):

دروست نيه ئافرەت لەئاهەنگدا هەلهەلە(الزغرطة) ليبدات چونكه ئەم بەرزكردنەوە لەكاتى ئامادەبوونى پياوان فتنەيە.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٨-(الشيخ ابن منيع):

دروست نيه برۆ بكريت، ج كەم ج به برين يان دەرهينان يان تەنك كردن هەموو ئەمانە روو كرنه (النمص) كه پيغەمبەر ﷺ لەعنەتى لى كردووه لەگوناهه گەورەكانه (الكبائر) دادەنريّ.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

١٩-(الشيخ ابن منيع)

دروسته ئافرەت مووى ريش‌و سميل‌و قاچ‌و دەستەكانى لاببات.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٢٠-(اللجنة الدائمة):

لەبەركردنى پيلاوى پاژنه بلند (كعب العالي) دروست نيه چونكه ئافرەتەكه بەشيوەيەك دەردەخات كه شيوەى سروشتى خۆى نيەو توشى بەربوونەوەى دەكات‌و بالاو سمتيشى زۆر دەردەخات.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

[redacted](اللجنة الدائمة)،

سوننەتە کاتێك هاوسەرەکان دەیانەوێ جووت بن ئەم زیکرە بخوێنن

(بسم الله، اللهم جنبنا الشیطان، جَنب الشیطان ما رزقتنا) رواه بخاري..

واتە: بەناوی خوا، خودایە دوورمان بخە لەشەیتان، شەیتان دوور بخەوە لەوەی پێمان دەدەی،

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٣٦-( الشيخ ابن العثيمين)،

من وادەبینم دەرگای دیاری (هدیە) بەبۆنەی هاوسەرگیری دابخرێ، چونکە ئەم ساڵ دیاری و ساڵی داهاتوو ئاهەنگو پاشان خۆراهێنان بۆ دووبارەبوونەوەو دەبێتە جەژن، بەڵکو لەجیاتی ئەمە پێویستە بەردەوام سۆزو خۆشەویستی هەبێ.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٣٧-(الشيخ ابن باز)،

ئامۆژگاری ئەو ئافرەتە دەکەم لەخوا بترسێ و ئارامی هەبێ و داوای تەلاق نەکات کاتێك پیاوەکەی خێزانی تر دەخوازێ، بێ گومان رازی بوونیشی دەبێتەهۆی خودای گەورە دەرگای خێرو خۆشی لێ دەکاتەوە هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێ ﴿ومن يتق الله يجعل له مخرجاً﴾.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٢٨-(اللجنة الدائمة) :

ئافرەت مەرجی تەلاق دانی هەوێیەکەی دابنێ، دروست نیە ئەو مەرجە جێ بەجێ بکرێ، بەوەی ئافرەتی یەکەم تەلاق بدرێ چونکە مەرجێکی فاسقە.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٢٩-(الشيخ ابن العثيمين)،

ئەگەر کچ بووە هۆی راکێشانی ئارەزووی پیاوان (با بالغیش نەبوبێ) واجبە حیجاب بپۆشێ لەبەر فیتنەو ئاژاوە هی وا هەیە زووپێدەگات وگەنج دەبێ هیواش هەیە درەنگ.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٣٠-(اللجنة الدائمة)،

دروست نیە پاڵدانەوەی ئافرەت لەگەڵ ئافرەتێکی تر لەسەر یەك جێگادا لەبەر فەرموودەی (وفرقوا بينهما في المضاجع).

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة)

٣١-(اللجنة الدائمة)،

هەر کەسێك گاڵتە بە ئافرەتێکی موسڵمان بکات لەبەر باڵاپۆشی یان دەستگرتنی بە شەریعەتی ئیسلامەوە ئەوە کافرە.

(أكثر من ١٠٠٠ جواب للمرأة).

٣٢-[illegible] کوری حنبل)،

ئافرەت دەتوانێ دەرمانێك بخوات كە خوێنی بێ نوێژی یەكەی بوەستێنێ بۆ ڕەمەزان یان بۆ حەج و عومرە، ئەگەر دەرمانەكە ناسراو بێت.

(المغني ١/٣٨١، المفصل ١/١٧٩)

٣٣-(امام النووري)،

ئافرەت حەیزدار بۆی نییە لەمزگەوت بمێنێتەوە بەڵام بۆی دروستە تێیدا تێپەڕێت بۆ پێویستییەك یان وەرگرتنی و پێدانی شتێك.

( شرح صحيح مسلم ج٣/٢٩)

٣٤-(الشيخ ابن عثيمين)،

ڕۆژووگرتنی ئەم ڕۆژە تەواوە ئەگەر ئافرەتێك خوێنی بینی و بۆی ڕوون نەبوو ئایا خوێنی حەیزە یان نەخۆشییە چونكە اصل ئەوەیە بەدەربكەوێ حەیزە.

(٥٢ سؤال عن احكام الحيض)

٣٥- (الشيخ ابن عثيمين)،

ئەگەر ئافرەتێك قژی تووشی ڕوشانەوە بوو مووی بەسەریەوە نەما ئەوا جائزە و دروستە قژی باروكە (دەستكرد) بەكاربهێنێ، هەرچەندە بەكارهێنانی ئەم قژە حەرامە بەڵام بۆ لابردنی عەیبە و داپۆشینی دروستە.

(فتاوى المرأة)

٣٦-(الشيخ عبدالكريم زيدان):

بۆچوونی پەسند (رای الارجح) ئەوەیە کە هەردوو پێیەکانی ئافرەت دەبێ داپۆشرێن‌و بەدیار نەخرێ بۆ پیاوی بێگانە تەنها لەکاتی پێویستی‌و یان هەژاری کەمیچی نەبوو لەپێ بکات.

(المفصل ج٣/٢٠٠).

٣٧-(الشيخ عبدالكريم زيدان):

بەرای زۆربەی زانایان دەنگی ئافرەت عەورەت نییە، بەلاّم کاتێک عەورەتە ئەگەر دەنگی بەرزو باریك بکاتەوە بۆ چێژ لێوەرگرتن گوێی لێبگیرێ، چونکە دەبێتە مایەی ئارەزوو بزواندنی پیاوان.

(المفصل ج٣/٢٧٩).

٣٨-(فتاوى العلماء):

ئەگەر ژنێك پیارەکەی مردو دووگیان نەبوو پێویستە چوار مانگ و دەرۆژ ماتەمی خۆی رابگەنێت‌و مێردنەکاتەوە بۆ ئەوەی رەحمی پاك بێتەوەو وەفاداری بۆ مێردەکەی لەگەڵ پەیرەو کردنی ئەم خالاّنە لەوماوەیەدا:

١-لەماڵەوە دەرنەچێت، بەلاّم ئەگەر کەس نەبوو کاری دەرەوەی بۆبکات دروستە بۆ خواردن کرین یان نەخۆشی دەربچێ.

٢- نابێت هیچ بۆن و عەترێك لەخۆی بدات.

٣- نابێ جلو بەرگی رازاوە لەبەر بکات نابێت رەشیش وەکو نیشانەی تازیە لەبەر بکات.

٤- نابێت زیرو وبو  ىكاتە بەری بەناوی رازاندنەوە ئەگەر حەلقەی پەنجەش بێ .

٥- نابێ خۆی ئارایشت بكاتو كل لەچاوی بكات.

٣٩-(الشیخ عبدالكریم زیدان):

زانایان رێگەیان داوە ئافرەت بۆیە بكاتەوە، بەلام هەندێك لەزانایان رەنگی رەشیان پێ دروست نییە، هەندێكی تریش پێیان دروستە ئافرەت بیكات بۆمێردەكەی بەلام بۆ كچ دروست نییە تاكو دوور بێت لەچەواشەو فێل كردن لەكاتی داخوازی.

(المفصل . ج٣).

تێبینی: هەندێ بۆیە كەلەبازاڕ هەیە بەكارهێنانیان دروست نییە ئەگەر بووە هۆی داپۆشینی موەكان یان نینۆك بەبەرگێك ریگربوو لەتەر بوون لەكاتی خۆشتنو دەستنوێژ.

٤٠-(الشیخ عبدالكریم زیدان):

ئەگەر ئافرەت سمێلی یان نێوان لێوو چەناگەی مووی لێ هات. باشتروایە موەكان بكات و لایانبدات.

(المفصل ، ج١ /٥٩)

٤١-(الشيخ ابن عثيمين)،

دروستە ژن و مێرد سەیری هەموو جەستەی یەکتری بکەن، چونکە خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ ﴾

المؤمنون: ٥ – ٦

(فتاوي المرأة لابن عثيمين).

٤٢-(الشيخ ابن عثيمين)،

دروست نییە ئافرەت بەتەنها سواری تەکسی بێت، چونکە (خلوەیە)و واتە کۆبوونەوەی ژن و پیاوی بێگانە حەرامە هەروەکو لەفەرموودەی داهاتووە.

(فتاوي المرأة / ص٨٩).

٤٣-(الشيخ ابن جبرين)،

دروست نییە ئافرەت تەوقە لەگەڵ پیاوی بێگانە بکات بادەستکێشیشی لەدەست بێ یان لەژێر عەباکەی یان هەرشتێکی لەسەردەستی بێت.

(فتاوي المرأة/ محمد المسند)

٤٤-(ابن قدامة المقدسي)،

ئەگەر ئافرەت لەریزی پیاوان راوەستا لەنوێژدا ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە بەڵام کەراهیەتی هەیە. (المغني ج٢/ ٢٠٤).

**فەرمووده:**

پیاوو خێزانە حەیزدارەکەی دەتوانن چێژ لەیەکتر وەربگرن بەمەرجێ دامەنی یان فەرجی داپۆشراوبێ، کان رسول الله (صلی الله علیه وسلم) اذا اراد من الحائض شیئا القی علی فرجها ثوباً ثم صنع ماراد.

(حدیث رواه ابو داود والبیهقي)

واتە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر ویستبای بچێتە لای یەکێ لەخێزانەکانی لەکاتی حەیزدا ئەوا پارچە قوماشێکی بەسەر داوێنی خێزانەکەی دا دەداو پاشان حە... ...امە دەبکرد.

(فەرمووده): دروست نییە ئافرەت د... ...ر دەمو چاوی بکوتێت و برۆکانی بکات و کەلێن و بۆشایی لەنێوان ددانەکانی دروست بکات، لعن رسول الله (صلی الله علیة وسلم) الواشمات و المستوشمات والنامصات و المتنمصات والمتفلجات للحسن المغیرات خلق الله.

واتە: ئەفرەتی خوا لەوانەی داوا دەکەن بکوترێن و ئەوانەی دەشکوتن لەوانەش برۆ دەکەن و ئەوانەی بۆشیان دەکەن، ئەفرەت لەوانەش کە کەلێن لەددانەکانیان دەکەن و دروست کراوی خودا دەگۆڕن.

(سید سابق)

﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ البقره: ١٨٤

واتە: قورئان قەزا کردنەوەی رۆژووی لەسەر نەخۆش و گەشتیار چەسپاندوە دووبارە بیگرنەوە، بەڵام قەزاکردنەوەی لەسەر سک پڕو شیردەر واجب نەکردوە.

(ابن عمروابن عباس): دەفەرموویێ ئافرەتی سک پڕ ئەگەر بەهۆی بەرۆژووبوون زیان بەخۆی یان بەمنداڵەکەی گەیشت پێویستە بەرۆژوو نەبێت فدیە بدات قەزاکردنەوەشی لەسەر نییە

وصلى الله على محمد واله وصحبه اجمعين